موحسین شوانی

# هەڵـــــەی مێژوو

هاوینی ٢٠٠٥

# بێداری

سەدو یازدە دەم هۆگری
بە کۆی دەنگی بەڵێ و نەخێر
سەدو یازدە پاڵەوانی
دیوەخانی دیموکراسی
دەست بە شمشێر
نمایشی تەباییە
یا دۆڕانی ئیرادەیە؟!
یا پەیمانی تا هەتایەی بێ دەنگییە؟
قۆناغێکی ترسناکە!
نوێنەری گەل ،
درۆ لەگەڵ
خۆی و گەل و میللەت بکا
بە ئاوازی کامە حیزب هەڵبپەڕین ؟
گوێ لە شیعری کام کادیری
دەمشڕ بگرین؟
کام فرمێسکی ئەندامانی
پەرلەمانی کەڕو لاڵە،
داماوەکەی خۆمان بسڕین؟
تا بڕیاری چارەنووسی ئەم میللەتە
لە نێو ژوورە داخراوەکان،

لە مەکتەبە ڕامیاریەکان،...
ئەندامان بۆ پێگەو جێگەو..
کورسی و مووچە ،....
دیسان چە پلە بۆ گەندەڵی .....
حەیرانێکی سەرچیایی
بۆ ژووانی
دوو دڵدارە تۆراوەکەی
نێو ئاوایی
ئەی خەڵکانی نێو شەقامی کوردەواری !
دەنگ هەڵبڕن
بۆ بێداری .

مەخموور    ٢٠٠٥/٥/٢٥

## دەنگی شەقام

*******

لە ڕووخساری شەقامەکان
باش بڕوانن،
بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەی
ئێوە دەیکەن
چاوەڕوانی دەمی درۆی دۆستێ مەبن !
من سنووری شارەوانی ئەو حیزبانە
شارەزا نیم ،
من ئەندام ولایەنگری
هیچ کامیان نیم
کە هاتمەوە
کام ناسنامە ،...
کامە ڕەنگ وکامە شیعرو کامە دیوان ...
لەگەڵ خۆمدا بهێنمەوە؟
وەرزی درۆو
بەرژەوەندی دابەشبوونە ،
بۆ دروێنەی کەللەی شەهید
شەرمەزاری و ئابڕووچوونە
باخچەی ساوا ،...
مزگەوتەکان شار و زانکۆ دابەشکران

**تەنیا پاداشت**

**بۆ هەڵە بجەو ئەنفالەکان**

**برا کوژی و...**

**دووهەرێم و...**

**نیو پەرلەمان .**

## هەڵەی مێژوو

*********

دوو هەزار و حەوتسەد ساڵە

گڕ لە جەستەی

کوردایەتیمان بەر ئەدەن

دوو هەزارو حەوت سەد ساڵە

یادی مەرگی ئەتەوەمان

بە ئاهەنگەوە پێ ئەکەن

کۆنە چەژنی

دووژمنێکی لە مێژینەم

لێ بۆتە چەژنی میللەتم

چ مەرگێکە !

دەڵێن ئاهەنگ

بۆ مەرگی شەهید پێویستە

بەڵام کەی کورد

بەم شەهیدیەوە سەربەستە

من زوحاکم ،

یا کاوەمە ؟

بە قوربانی کام چەکوژی

ئەو دەست و ئەو پیاوانەمە !

کاویس ئاغا

هەر زوو گوتی :

(کورد خائینە )

کوا مێژوومان ،

پڕیە لەلا پەڕەی کەوتن .....

کام لا پەڕەی

بە خوێنی دەستی ڕۆڵەکانی سوور نینە ؟!...

ئەی خودایە

کامە دۆستەو ...

کام دوژمنە ؟

من نازانم

مێژووم وونە

گەر نەورۆزیش کوردی نەبێ

ئەی لە مێژووی پێش ئیسلاما

چیمان دەبێ ؟؟.

٢٠٠٥/٣/٢٩

# خەلوە

*******

چل دانە قەسپی

ووشك بوو،

چل دانە ڕۆژی

بەسەر چوو

ئەشکەوتێکی تاریکستان

باوەڕێکی پا نەگرتوو

بەڵێنێکی بابە شێخ و

مژدەیەکی خەلیفە بوو

دەف وتەکیە و

جگەرەو چا ...

زیکرو زەرگ و..

شمشێر و خوو

دەروێشانی تەریقەت و

مەڕو بزن و....

موریدی بوو

٢٠٠٥/٥/٢٧

## هەڤاڵی بەند

********

زیندان لە ئاست وەرەی تۆدا
چی بۆ ناکرێ
کەلەبچەی دەست
بەرگەی دەستی
بە دەست نوێژی تۆ ناگرێ
چوار دیواری ژووری بەندیش
دوای ئاشنا بوون
بە شانازی ڕێزت دەگرێ
هەڤاڵی بەند
بێ بۆنی تۆ ،...
بێ نوێژی تۆ
ئامۆژگاری و
وتاری تۆ
گوێ بۆ کام ئیمامێ ڕاگرێ ؟.

مەخمور ٢٠٠٥/٣/٨

## کاســـــــــە لێس

*******

بیرتانە هەندێ بەگ وکێخواکان
هوتاف لێدەری بن ڕەشماڵەکان
بیرتانە یادی سەرکردەی بەعس
عێل وعەشیرەو بە هەزاران کەس
(بالروع بالدم) و گیان فیدا ئەبوون
سەرشۆڕو ڕیسوا بە عەرەب ئەبوون
ئەمە ڕەشماڵی کام عەشیرەیە؟
چەند سەر ئاژەڵی بۆ سەربڕیە؟
قەشەنگ وجوانە لافیتەی کام هۆز
بەڵێنی زەوی و تەعریبی پیرۆز!!
ئێستاش ئەمانە هەمان کێخوانە
زوڕنا لێدەرن بۆ ئەو حیزبانە
سەد ڕۆڵەی کوردیان بە کوشتدا ئەمان
ڕوو ڕەشیان بکەن ئامان سەد ئامان
بەڵێن و پەیمان بۆ شەهیدەکان
ئەوانەی خوێنیان دا بەکوردستان
ئیتر با بەس بێ دوو بەرەکیمان
ناحەزان دەرکەین لە ڕیزەکانمان
هەموو بە یەك دەنگ بڵێین کوردستان
بژی تەبایی و یەکڕیزی کوردان .

٢٠٠٥/٥ مەخمور

## سەربەرزی ئاین

********

یەکگرتنتان ،
خامەی دەست و..
هێزی بازوو...
باوەڕی پۆڵاینتان
مەرجە ئەمڕۆ بۆ سەرکەوتن
بۆ سەربەرزی ئاینتان
هێزتان نەما
کاتێ بوونە دەستە دەستە
دە یەکگرن
گەر ئێوە خواتان مەبەستە
بۆ کاری ئیسلامی ئەمڕۆ
کە پێویستە
یەکگرتن و یەك کۆمەڵی
زۆر دروستە
گەر ئەو ویێتن ئەم ڕێبازە سەربکەوێ
( خودا ) یەکە، هەر بۆیەشە ئەو یەکێتی لێتان دەوێ
گەر پەیرەوو
بەرنامەتان بەقورئانە
کەی دوولەتی
پەیامی ڕاستی ئینسانە.

مەخموور ٢٠٠٥/٧/

## سروودی ئەی موحەممەد

************

ئەی موحەممەد ئەی پێغەمبەر
ئەی شافیعی رۆژی مەحشەر
هەتا لە دونیا بمێنم
ناوی تۆ هەردەم دەهێنم
تۆ روناکی موسڵمانی
نوری چاوی هەمووماني
تۆ پێشەوای ئەبوبەکری
بۆ عەلی و عومەر ڕابەری
بۆ هەمزەو بۆ سەعدی وەقاس
پاڵەوانی شەڕی بەدری
تۆ مامۆستا و تۆ بەشیری
تۆ سەرکردەو تۆ نەزیری
شافیعی رۆژی مەحشەری
لە سیرات و لە کەوسەری

## دەنگ

*****

هەڵبژاردن و ڕاپرسی
لە ڕۆژانی مەترسی
کێ لە دەنگم نەپرسی
بۆ گەیشتن بە کورسی
دەنگم وڕەی چیایە
نەورەسییەو بەننایە
ئیقرەنی نێو حەڕایە
( بەدر ) و ( ئوحد )و ( ئیسڕا )یە
دەنگم دەنگی مینبەرە
پەیامی پێغەمبەرە
دەنگی بیلالە دەنگم
ڕەنگی هیلالە ڕەنگم

## سروود بۆ منداڵان

********

## منـــــــــــــاڵینە

وەرن گشتمان کۆبینەوە

لا پەڕەی ڕەش،

نەخشەی بەعسی پیس وچەپەڵ

لە کوردستان بسڕینەوە

لە جیاتی خەم ،..

فرمێسك وخوێن

زەردەخەنەو

پێکەنین بۆ ئایندەمان

دەرخەینەوە

بۆ ئەنفال و بۆ هەڵەبجە

وانەی ئاشتی و

سەرفرازی بڵێینەوە

( ئەی شەهیدان ) سروودمان بێ

( هەر کوردبوین و هەر کورد ئەبین )

ئیتر بەسە

( ئەلوەتەن ) و ( ئەلعروبە )

نەڵێینەوە .

## براکوژی

*******

لە هەشتاکان
لێیان پرسیم
لەخۆشترین ڕۆژی ژینم ؟
ئامازەم کرد بۆ هەڵە بجە
بۆ برینم
وتم : تـــــــخوا
کوانێ ژین و کوانێ بوونم
لەم ساتەدا
لە دەفتەری مردووانا
خۆم ئەبینم
دوای چەند ساڵێ
هەمان پرسیار هاتە پێشێ
لە وەڵاما
وتم : ئەشێ بۆم بنووسن
لە دایك بووی ڕا پەڕینم
لە پێنچی سێ !

هەڵبژاردن
دەنگدان بە هەق ،...

ڕابەری من
ڕابەری تۆ..ڕابەری کۆ
وتمان ویژدان !
با کەرکووکمان لە دەست نەچێ !
بابە گوڕ گوڕ...
زێڕی ڕەشمان زەوت نەکرێ
(گەر دەرنەچێ)
ئابڕو و ڕەوشت ئەتك نەکرێ
وتمان چەژنە
کورد خاوەنی پەڕلەمانە
خەونی کوردی دێر زەمانە
وتمان قەینا
فیفتی فیفتی
تاڵی و سوێری
وتمان قەینا
بێ نان، دەرمان ....
سەرمای زستان ،
هەرگیز نادەین بە کوردستان
وتمان ڕازین
هەمووی قەینا
خۆ ئازادین

بەلاّم تـــــــخوا

بۆ بەرپرسی ..

بۆ سەرکورسی.....

ئامان ..ئامان

ئاخ ڕا پەڕین

مەکەن بە یاری و هەڵپەڕین

ئەنجام ..ئەنجام

ئێمە ئێستا

هەر هەموومان برا کوژین.

١٩٩٧

## دوو لەتی

******

نەتەوەو گەلێکی کڕ
خاوەن دیوەخانی سڕ
کێخوا و ئاغا وبەگی شڕ
ماستاوچی وسەگی زۆر دڕ
ئەنفال و باوە گوڕگوڕ
کوا مافی عومەر خاوەر
کوردە ماڵتان دوو لەتە
گەمەی ئەو پەت وپەتە
کۆتایی ئەم مەینەتە
تەبایی و یەك حوکمەتە.

## ماچ

****

چی خۆشترە لە تامی ماچ ؟

ماچی دڵدار..

ماچی هیلال..

یا ماچی دەست..

یا ماچی خاچ

هەندێ ماچی کەعبە ئەکەن

هەندێ ماچی شێخ و مەرقەد

هەندێ ماچی خوێنی شەهید

هەندێ ماچی

خاک ..

چیا ...

بەرد

بەڵام تـــــــــــــخوا ماچی دەست و

دەمی دوژمن

چ پاداشتی هەیە بۆ من ؟

٢٠٠٤/٧/١٨

## کۆڕی شیعر

**********

بۆچی هاتوون؟
هاتوون ساتێ شیلەی دەم و
لێوی کچی  شیعر بمژن !؟
بۆ نازانن ،
برا و کەسی کچی شیعر
مەرج و نەختی ماچیان ناوێ !
بۆ مارەیی
بیرو خوێن و پاکیان دەوێ
ئەمە ژوانی شیعری ناڵی و..
حەبیبەکەی دڵی نییە،
ئەمە مەم وخاتو زینی
خانی نییە..
ئەمە شەم و دێوانەکەی
وەلی نییە
( لە دەستم دێ ) ی
خۆشەویستە تۆراوەکەی
پەشێو نییە،
شیعرم مێزی شەوانی بارِ نادوێنێ
ناوی خوشك و دایکانی شار

نازڕێنێ
من نامەوێ باسی قژو..
کەزی و پەرچەم
درکاندنی ڕازی سەرجێی
دێوانەو شەم

بۆچی هاتوون ؟
گوێ لە شیعری شاعیرێکی
سەر شێت بگرن ؟
ئاخر شیعری
دژە خواستی هەمووتانە
وشەو مانای
پێچەوانەی
بیرو بۆچوونی گشتتانە!
شیعر بۆ بالآی کێ بلێ
چە پلە ڕێزانی لێ بوێ ؟
هۆنەرێکی بەرجەستە نیم
بارەگاکان بمخوێننەوە
لایەنگران بملێسنەوە
من دەمەوێ
ڕەش و ڕووتی ئەم ولآتە

بمدۆزنەوە

من نامەوێ

شیعرەکانم لە نامەێی

کیژۆڵەی شار

لە ڕێ لادەن

شایەرانیش

لە ئاهەنگێ بە ڕیتمی شڕ

گیرفان پڕکەن

دڵی گۆران

لەسەر دارو بەردی سروشت

هەر زیندووە

ڕۆحی مەحوی

لە نێو دەروێشانی تەریقەتدا

نەمردووە

من شاعیرم وەکو حاجی

کورد لەدڵم ئاخی ئاخە

بەلاّم داخم یەکبوونی کورد

سەردەنێمەوە بەو داخە

یەك دوژمن و

هەزار برا ،

یەك نیشتمان
هەزار ئالآ
دەستی ناحەز ناگاتە کەس
ئەگەر دەستی نەنێینە دەس
دەنگمان
دەنگی ئێمە نییە
ڕەنگمان
ڕەنگی برا نییە
سەدان ساڵە خوێن دەڕێژین
کەچی خوێنیش
بێ بەرییە
من نازانم
حەقیقەتی ئەم یەکبوونە
لە ئەستۆی کام سەرکردەیە؟.

مەخموور ٢٠٠٤

## گەردن ئازادی

*******

کە بەفر بووی
ترسم نەبوو
دڵنیابووم رۆژێ دادێ
دەتوێیتەوە
قینی دڵ و رِق وخەمی
ئەوینداری دەسڕیتەوە
دەڵێن ئێستاش
بووی بە دەریا
لە بەفرو قین گەورەتری
نەك رِابردووی رەشی عیشقێ
پەشیمانی....
هەموو ئەوین
لە خۆت دەگری
دڵنیامە
بە شەپۆلی بەخشندەییت
لە کەناری بەزەییتا
تاوانی من هەمووی دەسڕی.

٢٠٠٥/٧/١٧

## سوپاس ئەو بەرێزانە دەکەم

که یارمـەتیان دام بـۆ لەچـاپدانی ئـەم بەرهەمـە یـونس محمـد ، بـەختیار پـالانی ، مامۆسـتا ادریـس عبـدالله ، خالـد حـسن علـی ، نەخشە دانەر: هەڤال سلیم حسین.



## شاعیر لە چەند دێڕێکدا

*محسن حمدامین حسین
ناسراوە بە محسین شوانی
*لەسالی -١٩٧١-لەدەشتی قەراج سەربە
قەزای مەخموور لە دایك بووە
*خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و
ئامادەیی لە مەخموور تەواوکردوو
*ئێستا مامۆستایە لەبنکەی فێرکردنی
پیشەیی مەخموور
*خێزاندارە خاوەنی چوار منداڵە

### بەرهەمە چاپکراوەکانی

- هەواڵی زیندان ٢٠٠٣شیعر
- ملیۆنیك و هەشت سەد واژوو ٢٠٠٤شیعر
- سێبەری پاشخانی کورد ٢٠٠٤شیعر
- هەلەی مێژوو ٢٠٠٥شیعر
- بێجگە لە شیعرنووسەر چەندین ووتار ونووسینی لەرۆژنامەکان بلاوکردۆتەوە

لەکتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارە سپاردنی
-٤١٣- سالی - ٢٠٠٥- دراوەتێ

Desgin : Haval S. Hussean
Naza Press
خانەی نازە بۆ کاروباری نەخشەسازی